


**ناوی نامیلکە: نوێژی بەیانی**

**نووسینی: عبدالله طاهر**

**تایپ: پەیمان محمد**

**تیراژ: (١٠٠٠)دانە**

**نۆبەی چاپ: یەکەم**

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٢٧٩)ی ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە**



ARA Media Center

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

هەنگاوێك بەرەو ڕاگەیاندنێكی كوردیی ئیسلامیی هاوچەرخ

ناونیشان: ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100

0750 106 9589

0748 013 4669

ara.m@hotmail.com

(من صلى البردين دخل الجنة)

هەرکەس نوێژی بەیانی و عەسر بکات

دەچێتە بەهەشتەوە

## پێشەکی:

خوێنەری بەڕێز، ئەم نامیلکەیەی بەردەستت سێ ئەڵقەیە لە بەرنامەی (درووود)، کە لەگەڵ برای بەڕێزم (شێخ فاتیح محمد سەمیع) پێشکەشم کرد، دواتر پێمان خۆش بوو هەمووان سوودی لێ وەربگرن، لەبەرئەوە پوختمان کرد و برای بەڕێز کاك (دانا عوسمان) خوا پاداشتی چاکەی بداتەوە داڕشتنەوەی بۆ ئەنجامدا و، هەندێك سەرنج و تێبینی نوێمان بۆ زیادکرد.

لەڕاستیدا ئەم زنجیرەیە لە ڕادیۆی (یەکگرتوو) پێشکەشکرا، بەڵام بەهۆی کەمی کاتی بەرنامەکە کە لە (٤٠) خولەك تێپەڕی نەدەکرد بەکورتی بابەتەکەمان پێشکەشکرد. ئەو هۆکارەش کە هاندەرم بوو بۆ ئامادەکردن و پێشکەشکردن و نووسین و چاپکردنی ئەم بەرنامە ڕادیۆییە زۆریی ژمارەی ئەو کەسانەیە کە دوادەکەون لە ئەنجامدانی نوێژی بەیانی، بەڵکو زۆرێك

لە گەنجان دەبینین گرنگی بە جێبەجێکردنی نوێژی بەیانی نادەن و، تەنانەت هەندێك لە بەتەمەن و بەساڵاچووەکان وازیان لەم نوێژە هێناوە و لەخەو هەڵناسن تا ئەنجامی بدەن، لەکاتێکدا هەمووان دەزانین کە خوای گەورە پێنج نوێژی لەسەر فەرزکردوین لە شەو و ڕۆژێکدا نەك چوار نوێژ.

لەڕاستیدا زۆر بەداخەوەم بۆ ئەو موسوڵمانانەی کە هەڵناسن بۆ نوێژی بەیانی ... ئەمە دەڵێم چونکە جۆرێك لە تەمبەڵیی و بێباکی و کەمتەرخەمیی هەیە دەرهەق بە نوێژی بەیانی و، شیاونییە مرۆڤی باوەڕدار خەو و ئیسراحەتی بەلاوە گرنگتر بێت لە پەرستن و گوێڕایەڵی خوای گەورە و، بەرزڕاگرتنی ئەم دروشمە گەورەیە کە بەوازلێهێنانی خۆی تووشی سزای خوای گەورە و لەدەستدانی چاکە و پاداشتێکی زۆر دەکات، وێڕای بێبەشبوون لەو سوودە تەندروستیانەی کە مرۆڤ دەستی دەکەوێت بەهۆی هەستانی بۆ نوێژی بەیانی.

پشت بەخوا هەوڵ دەدەین لەم نامیلکەیەدا زۆرێك لەو ئایەت و فەرموودانە بخەینەڕوو کە باس لە گرنگیی و گەورەیی نوێژی بەیانی دەکەن، بۆئەوەی خوێنەرانی بەڕێز بزانن چی هاتووە دەربارەی نوێژی بەیانی و فەزڵ و سوودەکانی و، دەربارەی مەترسی وازلێهێان و دواخستنی لەکاتی خۆی، خۆرهەڵاتن.

داواکارم لە خوای گەورە تەوفیقمان بدات خۆشنوود بین بە زیکر و موناجاتی بەیانیان و، فەزڵی بدەین بەسەر چێژوخۆشی جێگەی نەرم و گەرمدا.

جا هەرکەسێك دەیەوێت ڕزگاری ببێت لە سزای خوای گەورە، پێویستە سووربێت لەسەر ئەنجامدانی نوێژی بەیانی و بەکۆمەڵ لە مزگەوتدا بۆئەوەی مەحروم نەبێت لە پاداشت و چاکەی زۆر... هەروەك داواکارم لە خوای گەورە هەموو خوێنەرانی ئازیز سوودمەند بن لەم

بابەتە و، خوای باڵادەست ئیخلاصمان پێببەخشێت لە وتە و کردار و نیەتماندا.

لە خوای میهرەبان دەخوازم پاداشتی بەخێری هەموو ئەو بەڕێزانەش بداتەوە کە لە ئامادەکردن و بەچاپ گەیاندنی ئەم نامیلکەیەدا بەشدارییان کردووە، خوای گەورە بیخاتە تەرازووی کردەوەکانمانەوە.

درووود و سڵاوی خوا لە پێغەمبەر و هاوەڵ و یارانی.

عبدالله طاهر

سلێمانی ١٥/١/ ٢٠١١

# بەناوی پەروەردگاری جوانکار

نوێـژ ئـەو خـەڵات و بەخششـە خواییـە بـوو کـە لـەئاسمان بەخشـرا بـە ڕێزدارتـرین بەنـدەی خـوا کـە پێغەمبەرﷺ بوو، ئـەویش لەگـەورەترین و شـکۆدارترین ڕێوڕەسم و پێشوازیدا بۆ یەکەم جار لەئاسمان و شـەوی ئیسراو میعراجدا ئەم دیارییە درایە میوانی پەروەردگارو فریشـتەکان و سـەرجەم پێغەمبـەران، خـوای گـەورە ویستی وەها نەبوو کە پێغەمبەرەکەی بەدەست بـەتاڵی لەو میواندارییە مەزنەوە بگەڕێتەوە بۆ سـەر زەویو نـاو بەنـدە چاکەکان، بـەڵکو دەسـت قورسـی کـرد بەشـای خەڵاتەکان کە نوێژ بوو.

بـەڵێ خـوای گـەورە لـەنێو سـەرجەم فـەرزو داواکاریـەکانی خـۆی لەبەنـدەکانی نوێـژی دایـە پێغەمبەرەکـەی تـا بـۆ بـاوەڕدارانی بهێنێتـەوەو، بەهۆیەوە بەنـدەکانیش لەگەڵ خـوای خۆیانـدا گفتوگۆ

بکەن و ڕازی دڵ و داواکانیان بگەیەننە عەرشی بەرزی پەروەردگاریان.

ئەوەی زۆر مەبەستمانە لەدووتوێی ئەم نوسراوەدا باسی لێوە بکەین و گفتوگۆی لەسەر ئەنجام بدەین بریتییە لە نوێژی بەیانی، چونکە دەستپێکی (٤)نوێژەکەی ترەو کلیلی سەرجەم خێرو بەرەکەت و پاداشتەکانە لەژیانی بەندەکاندا، بەداخەوە لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا نوێژی بەیانی لەلایەن زۆربەی نوێژخوێنانەوە فەرامۆش کراوەو لەبیرکراوە، کە ئەمەش بووەتە هۆکاری بێخێرو بەرەکەتی لەژیانیانداو هۆکاری گەورەو سەرەکییە لەکێشەو گرفتەکانیاندا. هاندەری سەرەکیمان لەنووسینی بابەتێکی ئاوا هەستیاردا تەنها لەبیرکردن و فەرامۆشکردنی ئەم فەرزە گەورەیەیە لەلایەن زۆرێك لەنوێژخوێنانەوە، بەو ئومێدەی کە سوود لەم نوسراوە وەربگرین و ئەوانەمان کە ئەنجامدەری نوێژی بەیانین زیاترو چالاکانەتر ئەنجامی بدەین و

ئەوانەشمان کە نوێژی بەیانیمان لەبیرکردووەو جاروبار نەبێت ئەنجامی نادەین، بترسین و لەهەڕەشەکان بەئاگابێین و هۆشیاربین و پاساو بۆ نەکردنی نوێژی بەیانی نەهێنینەوە، چونکە هیچ پاساوێکی شەرعیو دروست نین تا ئەو فەرزە گەورەیە ئەنجام نەدەین و فەرامۆشی بکەین. خوای گەورە یارمەتیدەری هەمووان بێت و لەهەڵەکانمان ببورێت و پشتیوانمان بێت لەئەنجامدانی فەرمانەکانی خۆیدا. (ئامین)

# باسی یەكەم

# گرنگی نوێژی بەیانی

هەروەك پێشتر باسمان كرد كە هیچ بەندایەتیەك نییە لەنێو سەرجەم بەندایەتیەكاندا هێندەی ئەنجامدانی نوێژ خێرو پاداشت و گەورەیی هەبێت لەلای خوای گەورە، چونكە (نوێژ) گفتوگۆی ڕاستەوخۆی نێوان بەندەو پەروەردگاریەتی و مرۆڤە باوەڕدارەكان هەركات خوازیاری گفتوگۆو دەربڕینی رازو نیازەكانیان بن لەگەڵ خوای خۆیاندا، ئەوە بێگومان دەتوانن بەئاسانترین و سادەترین شێوە ئەم كارە ئەنجام بدەن و قسە لەگەڵ گەورەترین و بەهێزترین و خاوەندارترین (زات)دا ئەنجام بدەن كەخوای باڵادەستە، ئەمەش بەپێچەوانەی سەرجەم ئەو خاوەن هێزو دەستەڵاتە دونیاییانەی كە مرۆڤە سادەو كەس نەناسەكان بەدەیان هۆكارو پرسگە ئەوجا گەر بگەنەلایان و قسەیان لەگەڵدا

بکـــەن!!؟! شـــیرینی نوێــژ بەتایبـــەتیو ســـەرجەم
بەندایەتیەکانی تر بەگشتی لەوەدان، کەبۆ خـوا ئـەنجام
دەدرێن نەك بۆ غـەیری ئـەو، پـەروەردگار زانـاو پێزانـە
لەبەرامبەر بەندایەتی و داواکاری و لاوازی و پێداویستی
و نهێنی نێودڵی بەندەکانی و، دەزانـیّ کـە چـی لـیّ داوا
دەکـەن، هـەر لەبەرئەمەیـە کاتێك بەندەیـەك بەڕاستی
نوێژ دەکات یان هەر بەندایەتیـەکی تـر ئـەنجام دەدات،
لـە ناخـەوە هەست بـە ئاسوودەیی دەکـات و تـەواوی
ناخۆشـییەکانی لەبیردەچـێتەوە، نهێنـی ئـەم حاڵەتـە
تایبەتەیە ئەوەیە کـە قورئـان لەبارەیـەوە دەفـەرموێت:
﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾[1]. بــــەڵیّ لـــــەناو
ســەرجەم بەندایەتیەکانـدا (نوێـژ) پلەوپایـەی تایبـەتی
هەیـەو، لــەناو ئەوانیشــدا نوێــژی (بــەیانی و عەســر)
تایبەتمەنـــدکراون و، فــــەزڵ و گـــەورەیی تـــەواویان

---

١- الرعد: ٢٨.

پێـــدراوەو، مـــژدە بەخشـــراوە بەئەنجامـــدەرانی بـــە بەهەشت، هەروەك خۆشەویســتﷺ دەفـەرموویێت: (مَـن صَلَّى الـبردين دخـل الجنـة)[٢]. واتــە: هەرکـەس نوێـژی بـەیانیو عەسر ئـەنجام بـدات لـەکاتی خۆیـدا دەچـێتە بەهەشـتەوە. بـەڵێ ئەنجامـدانی نوێـژی بـەیانی مانـای ڕۆژێکـــی خێـــردارو پڕبەرەکـــەت بـــۆ ئەنجامـــدەرانی دەسەلمێنیٚ، کە دواتر بەیارمـەتی خـوای گـەورە باسـی لێوە دەکەین، نوێژی بـەیانی یەکـەم نوێـژە لـەزنجیرەی نوێژە فـەرزەکانی تـرو، پێکـدێت لـەدوو ڕکـات و سـاتی ئەنجامـدانی بریتییـە لەســەرەتای بەرەبـەیان تـا کـاتی پێش هەڵهاتنی خۆر، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (و وقــتُ صــلاةِ الـصـبحِ مِـن طلـوعِ الفجـرِ مـالَم تَطلـعِ الشمس)[٣].

---

٢- رواه البخاري ومسلم.

٣- رواه مسلم.

واتە: کاتی نوێژی بەیانی دەکەوێتە ماوەی نێوان دەرکەوتنی بەرەبەیان تا ئەو کاتەی کە خۆر هەڵنەهاتووە.

(مَن أدْرَكَ ركعةً مِن الصبحِ قبلَ أنْ تطلع الشمسُ فقد أدركَ الصبحَ)[4]. واتە: هەرکەس پێش هەڵهاتنی خۆر فریای یەك ڕکات نوێژی بەیانی بکەوێت ئەوە بەتەواوەتی فریای نوێژی بەیانی دەکەوێت، واتە بە حازری دەیکات نەك بە قەزا. پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵان و قوتابیانی دەوری خۆی هێندە ئامۆژگاری کردبوو لەسەر ئەنجامدانی نوێژی بەیانی، گەر لەسەختترین کات و ساتیشدا ببونایە دەستبەرداری ئەم فەرزە گەورەیە نەدەبوون و هیچ پاساوێکیان بۆ نەکردن و لەدەستدانی نەدەهێنایەوە، یەکێك لەو هاوەڵە بەڕێز و خاوەن عیزەتانەی کە لەقوتابخانەی پێغەمبەردا ﷺ

---

٤- متفق عليه.

بــوو بەمامۆســتاو چاوســاغ و پێشــەوا بــۆ مرۆڤایــەتی بەگشــتیو بــاوەڕداران بەتایبــەتی (عومــەری کــوڕی خــەطـاب) بـوو (رەحمـەتی خـوای لێبـێ)، لەسـەردەمی خەلافەتی خۆیداو لەمزگـەوتی پێغەمبـەرداﷺ، لەسـاڵی (٢٣)ی کۆچـیدا، پێشــەوا عومــەر لــەماڵ هاتــەدەرەوەو بــەرەو مزگــەوت بەڕێکــەوت تــا نوێـژی بــەیانی ئــەنجام بدات، بەڵێ بـانگ دراو عومـەر ڕیـزی موسـوڵمانانی نێـو مزگـەوتی یەکخسـت و دەسـتی کـرد بەنوێـژ و بـوو بـە (ئیمام)، نوێـژ دابەسـتراو لـەم کاتـە ئـارام و بێدەنگـەدا (أبــو لؤلــؤ)ی مەجوســی خــۆی کــرد بــەنێو ڕیــزی موسـڵمانانداو لــەدواوە چــەند چــەقۆیەکی ژەهــراوی دا لەپشتی عومەر و دواتر ڕایکردو، هـەر بـەو چـەقۆیەش چەند هاوەڵێکی تری بریندارکرد بەڵام نـەیتوانی دەربـاز ببێــت و ســەرەنجام بەســزای خــۆی گەیشــت. عومــەر دەستی (عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف)ی گرت و هێنایە جێگەی خۆی تــا نوێژەکـەیان بـۆ ئــەنجام بـدات، دواتــر

هاوەڵان پێشەوا (عومەر)یان بردەوە بۆماڵەوەو، دەستە دەستە هاوەڵان و خەڵکی سەردانیان دەکردو بەسەر سەریەوە وەستابوون و، هەموویان کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە پێشەوا (عومەر) هەر خەمی نوێژەکەیەتی. بەڵێ کاتێك هۆشی هاتەوە بەخۆیدا وتی: بەڵێ سوێند بەخوا هەر دڵم لای نوێژە، پاشان ڕووی کردە (ئیبن عباس)و پێی وت: (أصَلَّى النَاسُ)؟ قال: نعم.

واتە: خەڵکی نوێژەکەیان ئەنجام دا؟! ئەویش وتی: بەڵێ.پاشان پێشەوا عومەر وتی: (ئەوەی نوێژناکات و دەست بەرداری دەبێت هیچ بەشێکی لە ئیسلامدا نییە)، پاشان فەرمانی کرد کە ئاوی بۆ بهێنن، دەستنوێژی گرت و نوێژەکەی ئەنجام دا، لەکاتێکدا کە خوێنی لەبەر دەڕۆیشت! !بەڵێ ئەمە حاڵی هاوەڵان و قوتابیانی دەوری پێغەمبەر بووﷺ بۆ نوێژەکان بەگشتیو نوێژی بەیانی بەتایبەتی، تەنانەت

لەسەختترین و ناخۆشترین کاتدا کە برینداریو خوێن لەبەر ڕۆیشتن و کاتی سەرەمەرگ و دونیا بەجێهێشتنە ! ! بەراوردکردنی ئەم حاڵەتە سەختە بەژیانی ئێستەی موسوڵمانان دژواریو جیاوازی زۆر گەورەی تێدا بەدی دەکرێت، ئەویش بەو شێوەیەی کە ئەمە حاڵی ئەوان بووە بۆ ئەنجامدانی نوێژ، جا هەرنوێژێك بێت بەتایبەت (نوێژی بەیانی)، کەچی ئێمەش لەناو پێخەفی گەرم و نەرم و بەلەشی ساغ و بێ ترسەوە ئامادەیی ئەوەمان تێدا نیە کە دەست بەرداری جێگەی خەومان ببین و هەستین لەپێناو ڕەزامەندی خواو ئەنجامدانی ئەو فەرزە گەورەیەو بەدەستهێنانی ئەو پاداشتە مەزنە لەکەمترین کاتدا کە کەمتر لە (١٥) خولەکی پێدەچێت! ! ! ؟ لەکاتێکدا ئامادەین دەیان کاتژمێر بەسەر بەرین لەپێناو سودی زۆر کەم و دونیاییدا. بەڵێ کاتی نوێژەکان دیاریکراون، بەتایبەت نوێژی بەیانی کاتێکی کەمی لەبەردەمدایەو

بەدەرکـەوتنی تیشـکی خـۆر کاتەکـەی دەڕوات، لـەم بارەوە خوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾[5]. واتە: بەڕاستی نوێژ لەسـەر بـاوەڕداران فـەرزەو لـەکاتی دیـایکراودا دەبێـت ئەنجام بدرێت.

نابێـت لـەکاتی دیـاریکراوی خـۆی تێپـەڕێنریٚ بـەبیٚ هۆیەکی دروست، ئەگەرنا ئەوە ئەو نوێژە لەکاتی خۆیدا نـەکراوەو ڕۆیشـتووە!! خـوای گـەورە دەربـارەی ئەوکەسانەی کە نوێژەکانیان لەدەست دەدەن و لەکاتی خۆیـدا ئـەنجامی نـادەن دەفـەرمووێت: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا﴾[6]. واتـە: لـەدوای ئـەوان کەسـانێك لەنـەوەکانیان

---

٥- النساء: ١٠٣.

٦- مریم: ٥٩

بوونە جێنشین کە نوێژەکانیان بەزایە دەدا و شوێنی ئارەزووەکانیان دەکەوتن، ئەوانە توشی گومڕایی‌و سەرگەردانی‌و سزا دەبن.

زانای پایەبەرز (ئیبن عەباس) لەتەفسیری وشەی (أضاعوها) دەڵێت: (أي أخرُّوها عن وقتِها) واتە: دواخستنی لەکاتی خۆیدا. بەڵام گەر کەسێك تەواوی هۆکارەکانی هەستان بۆ نوێژی بەیانی گرتەبەرو لەوکاتەدا (خەو) بەسەریدا زاڵبوو، ئەوە گوناهی لەسەر نیەو هەرکات بەخەبەر هات با نوێژی بەیانی ئەنجام بدات، پێغەمبەرﷺ لەم بارەوە دەفەرموویت: (أمَّا إنَّه ليس في النوم تفريطٌ إنَّما التفريطُ على مَن لم يُصَلِّ الصلاةَ حتى يجيء وقتُ الصلاةِ الأخرى)[٧].

---

٧- رواه مسلم.

واتــە: ئاگــادار بــن، خــەوتن نابێتــە کەمتەرخــەمی، بەڵکو کەمتەرخەمی ئەوەیە: کەسێك نوێژێك نەکات هەتا کاتی نوێژێکی تر دێت.

بێگومان ئەو کەسەی کە تەمبەڵی دەکات لەنوێژی بەیانیداو ئەنجامی نادات ئەوە شەیتان (میـز)ی کردۆتــە گوێچـکەکانیەوەو ئەوەنـدی تــر بــەنج و بێهـۆش و بــێ ئاگــای دەکــات، هــەروەك هــەواڵی کەســێکیان دا بەپێغەمبـەرﷺ کـە دەخـەوێت و نوێـژی بـەیانی ناکـات، پێغەمبــــەرﷺ لەبەرامبــــەر حــــاڵی ئــــەو کەســــەو هاوشـێوەکانیدا فـەرمووی: (ذاك رجـلٌ بـال الشـيُطانُ في أذُنَيه، أو قال في أذنه)[8].

واتە: ئەوە پیاوێکە شـەیتان میـزی کردۆتـە هـەردوو گوێچکەیەوە، یان میزی کردۆتە گوێچکەیەوە.

---

٨- متفق عليه.

# باسی دووەم

## چۆن هەڵبسین بۆ نوێژی بەیانی؟!

گومـان لـەوەدا نیـە کـە نوێـژی بـەیانی دەکەوێتـە کاتێکی هەستیارەوە ئـەویش شـیرینی خـەوە، ئەمـەش وای کردووە لە نوێژخوێنان نەتوانن ئەم فەرزە گەورەیە لـەکات و سـاتی خۆیـدا ئـەنجام بـدەن، بەمـەش نوێـژی بـەیانی بووەتـە یـەکێك لـە فـەرزە فـەرامۆش کـراوو لـەبیرکراوەکان لـەلای زۆربـەی خـەڵکی، کـە بێگومـان ئەمەش نهێنـی سـەرجەم ئـەو بـێ بەرەکـەتیو دژواریو ناخۆشیەیە کە ڕۆژانە لەژیانی خەڵکیدا بـەدی دەکرێت. بەیارمەتی خوای گەورە لەم بڕگەیەدا باس لەو ڕێگایانـە دەکـەین کـە دەبنـە هۆکـاری هەسـتانمان بـۆ نوێـژی بەیانیو ئەنجامدانی ئـەو فـەرزە لـەبیرکراوە، سـەرەتای ئەم هەنگاوە لەوەوە دەست پێدەکات کە:

## ١- ئیرادەی بەهێز:

هـیچ کارێـك نیـە لـەژیانی مرۆڤەکانـدا سـەخت و نارەحەت و قورس بێت گەر مرۆڤەکان مەبەستیان بێت ئەنجامی بدەن، نوێژی بـەیانیش یەکێکە لـەو نوێژانـەی کـە لـەکاتێکی هەسـتیاردا ئـەنجام دەدرێـت، گـەر نوێژخوێنان بەئیرادەیەکی پتەوو بـەهێزەوە رووبـەڕووی بەربەستەکانی سـەرماو خـەوی خـۆش و جێگـەی گـەرم ببنـەوە، ئـەوە بەدڵنیاییـەوە زۆر بەئاسـانی دەتـوانن چالاکانە هەستن بۆ نوێژی بـەیانیو وەك نوێـژەکانی تـر ئـەنجامی بـدەن.هێـزی ئـیرادەو ویسـتی مرۆڤەکانـە کـە کـارە مەحاڵـەکان دەکەنـە واقیـع و دەیانهێننـە دونیـای بوونەوە، گەر مـرۆڤ ویسـت و ئـیرادەی کـارێکی هـەبێت ئەوا مەگەر ویستی خـوا ڕێگـەی نـەدات گـەرنا ئـەنجامی دەدات و کاری سەرسوڕهێنەریش ئەنجام دەدات.

سەرجەم پێشکەوتنەکانی دونیا کە دەیان بینین و سودیان لێوەردەگرین بریتین لەبەری ڕەنج و هێزی ئیرادەی مرۆڤە ماندوونەناسەکان، کە ویست و ئیرادەی ئەوکارە گەورەو گرنگانەیان هەبووەو لەئەنجامدا بەئاوات و ئامانجی خۆیان گەیشتوون.

٢- نیەت:

یەکێکی تر لەو خاڵە گرنگانەی کە هۆکارن بۆ هەڵسانمان لەجێگەی گەرم و ئەنجامدانی نوێژی بەیانی بریتییە لە (نیەت) کە تۆی باوەڕدار لەکاتی خەوتن و لەناخی دڵتدا بەنیەتی ئەوە بخەوێت کە خوای گەورە یارمەتیت بدات و بەخەبەرت بهێنێت بۆ نوێژی بەیانی، ئەوە بێگومان خوای گەورە بەنیەتی پاکی خۆتت لەگەڵدا دەکات و یارمەتیت دەدات ئەو فەرزە گەورەیە ئەنجام بدەیت، بەڵام ئەگەر کەسێك لەنیەتیدا نەبێت هەڵبسێت بۆ نوێژی بەیانیو بێخەم لێی بخەوێت و بڵێت:

نوێـژی بـەیانی بـەمن ناکرێـت و سـەختە ! ! کـە بـەیانی هەسـتام ئـەوجا ئـەنجامی دەدەم یـان لەگـەڵ نوێـژی نیـوەڕۆدا ئـەنجامیان دەدەم! ! ئـەوە بێگومـان ئـەم کەسەو هاوشێوەکانی هەرگیز ناتوانن بۆ نوێـژی بـەیانی هەسـتن و ئـەنجامی بـدەن، چـونکە مرۆڤـەکان چـۆن بیربکەنـەوەو نیـەتیان چـۆن بێـت ئـاواش ڕەفتـارو هەڵسوکەوت دەکەن، کەواتە کردارو ڕەفتاری مرۆڤـەکان بـەرەنجامی نیـەت و جـۆری بیرکردنەوەکانیانـە. بـەو مانایەی کە چۆن بیربکەنەوەو نیەتی دڵیان چـۆن بێـت، ئاوا هەڵسوکەوت دەکەن لەواقیعدا.

## ٣- زوو نوستن:

باشـترین هۆکـاری کـرداری بـۆ ئەنجامـدانی نوێـژی بـەیانی بریتییـە لـەزوو نوسـتن، چـونکە زوو نوسـتن مرۆڤـەکان تێرخـەو دەکـات و بـزاف و وزەی باشـیان دەداتـێو چـالاکیان دەکـات بـۆ هەسـتان لەخـەو و

ئەنجامـــدانی نوێــژی بـــەیانی، مرۆڤــە تەندروســـتەکان (٦بۆ٨) سەعاتیان بەسە بۆ خەوتن و ئیسراحەت لەشەو و ڕۆژێکـدا، لەبەرامبــەر ئەمـــەدا کەســانێکی زۆر هـــەن لەنوێــژخوێنان و غـــەیری ئـــەوانیش تـــا دەرەنگـــانێ دادەنیشـــن بـــەدیار تەلـــەفزیۆن و ســـەتەلایت و دواتـــر دەخەون و کاتێك بەخەبەردێت خۆر هــەڵهاتووە، ئــەوجا دەڵێــت: نوێژەکــەم ڕۆیشــت؟! بێگومــان ئــەم جــۆرە کەسانە ئـەو ئایەتـەیان بەسـەردا جێبـەجێ دەبێـت کـە خـــوای گـــەورە دەفـــەرموویێت: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ﴾[٩].

بێگومان ئەمانە گەر زوو بخەون ئەوە بێگومـان تێرخـەو دەبـن و دەتـوانن چـالاکانە هەسـتن بـۆ نوێـژی بـەیانی، بێگومان خوای گـەورەش ئـەم جـۆرە کەسـانەی خـۆش ناوێـت، پێغەمبـەرﷺ دەربارەیـان دەفـەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ

٩- مريم:٥٩

يبغَضُ كلَّ جعضريٍّ جواظٍ سخابٍ في الأسواقِ جيفةٌ بالليل حمارٌ بالنهار، عالمٌ بالدنيا جاهلٌ بالآخرة)[10]. واته: خوا ڕقی لە هەموو بەدڕەوشتێکی بەفیز و لوتبەرزە، دەمەوەر لە بازاڕەکاندا، بە شەو کەلاکی تۆپیوە و بە ڕۆژیش گوێدرێژ، لێزان لە کاروباری دنیاداو نەزان لە کاری قیامەتدا.

## ٤ - بەکارهێنانی هۆکاری بەخەبەرهێنانەوە:

ئەمەش یەکێکی ترە لەهۆکارە کاریگەرەکان لەهەستانمان بۆ نوێژی بەیانی، بێگومان هۆکارەکان لەم سەردەمەدا زۆرن و هەموو کەس دەتوانێت دەستەبەریان بکات، ئەوانیش وەك: (تەوقیتکردنی سەعات یان مۆبایل، یان کەسێك کە ڕاهاتووە لەسەر هەستان بۆ نوێژی بەیانی، کەسانی تریش هەڵبسێنێت و

---

١٠- رواه البيهقي وإسناده صحيح على شرط مسلم، وابن حبان (٢٧٢/١) والديلمي (١٥٢/١).

ئاگاداریان بکاتەوە). بەڵێ هەموو ئەمانەی کە باسمان کرد هۆکاری کرداریو کاریگەرن بۆ ئەوکەسەی کە بیەوێت هەستێت بۆ نوێژی بەیانی. دوای ئەوەی باوکان و دایکان ئەم ڕێگایانەیان تاقیکردەوەو سەرکەوتووبوون تیایدا، ئەوجا دەبێت بەمە کۆتایی بەم کارە گرنگە نەهێنن و گەر منداڵیان هەبوو ئەوانیش بەخەبەربهێنن، تا هەر لەمنداڵییەوە فێری ئەنجامدانی نوێژی بەیانی ببن و لەکاتی گەورەبوونیاندا سستیو تەمبەڵی نەنوێنن لەبەرامبەر ئەنجامدانیدا.

خوای گەورە فەرمان بەدایك و باوکەکان دەکات کە منداڵەکانیان فێری نوێژو ئەنجامدانی بکەن هەروەك دەفەرمووێت: ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَالْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴾[11]. واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی باوەڕداران، فەرمان بەتاکەکانی

---

١١- طه:١٣٢

خێزانەکانتان بکەن تا نوێژ بەباشی ئەنجام بدەن و بەردەوام بن و ئارامگربن لەسەری، ئێمە داوای ڕزق و ڕۆزی لەتۆ ناکەین، بەڵکو ئێمە ڕزق و ڕۆزی بەتۆ دەبەخشین، عاقیبەت و سەرەنجام هەر بۆ خواناسیو تەقوایە.هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:

(مُروا أولادَكم بالصَّلاةِ وهُم أبناءُ سبعِ سنين، واضربوهُم عليها وهم أبناءُ عشرِ سنين، وفَرِّقوا بيْنَهم في المَضاجِعِ)[12].. واتە: فەرمان بەمنداڵەکانتان بکەن بەنوێژکردن کاتێك تەمەنیان (٧) ساڵانە و، لێیان بدەن لەسەر نوێژ نەکردن کە تەمەنیان گەیشتە (١٠)ساڵ، پاشان جێگەیان لەیەکتر جیابکەنەوە لەگەڵ براو خوشکەکانی تردا با پێکەوە نەخەون.بەڵێ گەر منداڵ هەر لەسەرەتای تەمەنیەوە ڕاهێنرا لەسەر ئەنجامدانی نوێژەکان بەگشتیو نوێژی بەیانی بەتایبەتی، ئەوە بێگومان لەکاتی گەورەبوونیدا زۆر بەئاسانتر دەتوانێت

---

١٢- أخرجه أحمد و أبو داود، وقال الألباني: حسن صحيح.

نوێژ ئەنجام بدات و، زۆرێك لەخەڵکی لایان قورسە کە منداڵەکانیان هەستێنن بۆ نوێژ یان بەحسابی خۆیان سۆزو بەزەییان هێندە زۆرە دڵیان نایەت منداڵەکانیان خەبەر بکەنەوە بۆ نوێژی بەیانی!!

بەڵام لەڕاستیدا ئەم کارە دەربڕینی سۆز نیە بۆ منداڵ لەلایەن دایك و باوکەوە، بەڵکو ڕاهێنانیەتی لەسەر سستیو تەمبەڵی.

## ٥- دوعاکردن:

پێنجەم هۆکار بۆ هەستانمان لەنوێژی بەیانیدا بریتییە لەداواکردن لەخواو پاڕانەوە لێی کە یارمەتیدەرمان بێت لەبەئەنجام گەیاندنی ئەم فەرزە گرنگەدا، چونکە دوعا کلیلی سەرجەم دەرگا داخراوەکان و کردنەوەی گرێ کوێرەکانە.

# باسی سێیەم

# ئەنجامدانی نوێژی بەیانی نهێنی سەرکەوتنەکان بووە!!

جەنگاوەران و خەباتکارانی ئەم ئوممەتە موسوڵمانە هەرکات ڕووبەڕووی بێباوەڕان و ستەمکاران دەبوونەوە سەعاتی سفریان بۆ دەستپێکردنی جەنگ و جیهاد لەگەڵ دوژمنانی خوادا، بریتی بوو لەدوای نوێژی بەیانی، چونکە باش دەیانزانی کە ئەنجامدانی نوێژی بەیانی لەکات و ساتی دیاریکراوی خۆیدا هێزێکی بێسنوری مەعنەویو ڕۆحییان دەداتێو، دەبێتە مایەی داباریینی بەرەکەت و ڕەحمەتی خوای باڵادەست بەسەریاندا، پاشان دامەزراویو سەرکەوتنیان پێدەبەخشێ بەسەر دوژمنەکانیاندا کە لەڕووی ژمارەو هێزی سەربازیەوە لەموسوڵمانان زۆرتر بوون.(صەخری غامدی) لەپێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەیفەرموو:

(اللهم بارِكْ لأُمَّتي في بُكُورِها)[١٣]. واتە: ئەی پەروەردگارم بەرەکـــەتی خـــۆت ببارێنـــە بەســـەر ئومەتەکەمـــدا لەبەرەبەیاندا.

وە هەرکات پێغەمبەرﷺ هاوەڵانی بەڕێ بکردبایە بۆ جەنگ و جیهاد، ئـەوە لەبەرەبەیانـدا بـەڕێی دەکـردن، پاشان (صخر) خۆی پیاوێکی بازرگان بوو، گەر کاروانی بازرگانیەکـەی بخسـتایەڕێ، ئـەوە لەبەرەبەیانـدا ئـەم کارەی دەکرد. لەسەردەمی پێشەوا عومەردا سەربازانی ئیسلام بەڕێکەوتن بۆ رزگارکردنی ئەو شارو دەڤەرانـەی کـە لـەژێر سـتەم و چـەپۆکی بێبـاوەڕان و سـتەمکاراندا بوون، یەکێك لەو شوێنانە ناوی (تستر) بـوو کـە شـارێك بوو لەشارەکانی وڵاتی (فـارس)، هـاوەڵان بەڕێکـەوتن و ئـەبو موسـای ئەشـعەریو ئەنەسـی کـوڕی مالیکیشـیان تێدابوو، ماوەی ساڵ و نیوێك موسوڵمانان گەمارۆی ئەو

---

١٣- رواه الخمسة إلا النسائي.

شارەیانداو سەرەنجام دەرگاری شورای ئەوشارەیان شکاندو چەند سەعاتێك پێش نوێژی بەیانی چوونە ناو قەلاکەوە، هێزی موسوڵمانان لەناو شوراکەدا تووشی شکست بوون، هێزی موسوڵمانان ژمارەیان (٣٠) هەزار جەنگاوەربوون، لەبەرامبەر هێزی فارسە ئاگرپەرستەکان کە ژمارەیان (١٥٠) هەزار سەربازبوو. جەنگەکە زۆر سەخت بوو، چرکەیەك تێنەدەپەڕی بەبێ کوشتار، بەڵێ جەنگ بەردەوام بوو تا سەرەنجام بەیارمەتی خوای گەورە موسوڵمانان بەسەر فارسەکاندا سەرکەوتن، ئەویش لەساتی دوای هەڵهاتنی خۆردا.باوەڕداران ئەوجا بیریان کەوتەوە کە نوێژی بەیانیان ڕۆشتووە!! لەکاتێکدا کە هیچ بواری نوێژکردنیان نەبوو!! بەلام (ئەنەسی کوڕی مالیك) بەردەوام کە بیری ڕۆژی (تستر)ی دەکەوتەوە دەستی دەکرد بەگریان بۆ ئەو نوێژەی بۆیان ئەنجام نەدرا تا خۆر هەڵهات؟ لەکاتێکدا کە پاساویان هەبوو، هەروەها

لەجەنگـدا بـوون و سـەرقاڵی جیهـادبوون لـەپێناوی خـوادا!! سـەرنج بـدە!! ئێمـە دەبێـت چ پاسـاوێکمان هەبێت لەنوێژی بەیانیدا، لەکاتێکدا کـە لـەناو پێخـەفی گەرم و نەرمدا بین، نەك لەجیهاددا!! گەر (ئەنەس) بـۆ تـەنها لەدەسـتدانی نوێـژێك گریابێـت کـە پاساویشـی هەبوو، ئـەوە دەبێـت ئێمـە تـا دەمـرین هـەر بگـرین بـۆ لەدەسـتدان و نـەکردنی نوێـژەکانمان بەگشـتی لـەکاتی خۆیداو نوێـژی بـەیانیمان بەتایبـەت، کـە لای زۆربـەمان لەبیرکراوەو وادەزانین کە فەرزەکان (٤)ن نەك (٥)؟!!

# باسی چوارەم

# مژدەو پەیمان بۆ ئەوانەی کە نوێژی بەیانی فەراموش ناکەن و لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا ئەنجامی دەدەن

بێگومـان ئەنجامـدانی سـەرجەم نوێـژە فـەرزەکان بەگشتیو نوێژی بەیانی بەتایبەتی گەورەترین پاداشت و مژدە بۆ ئەنجامدەرانی بەدەست دەهێنن و، توشی خێرو بەرەکەتی دەکەن چ لەدونیاو چ لەدوارۆژدا، کە ئەوانیش بریتین لە:

## مژدەی یەکەم:

ئەنجامـدانی نوێـژی بـەیانی مانـای ئەنجامـدانی گـەورەترین و ڕێزدارتـرین نوێـژ دەگەیـەنێت، چـونکە گەورەترین نوێژ لـەلای خـوای گـەورە نوێـژی بەیانییە هەروەك خۆشەویست لەم بارەوە دەفـەرموێت: (أفضلُ

الصلواتِ عندَ اللهِ صلاةُ صبحِ يومِ الجمعةِ في جماعةٍ)[14].
واتە: باشترین و گەورەترین نوێژ لەلای خوای گەورە نوێژی بەیانییە لەڕۆژی هەینیدا کە بەکۆمەڵ بکرێت.

## مژدەی دووەم:

مژدەدان بەئەنجامدەرانی نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ بەوەی کە لەڕۆژی دوایدا ڕووناکی تەواویان پێدەبەخشرێت، بێگومان ئەم مژدەیەش بۆ ئەو کەسانەیە کە بەتارێکی ڕێگە دەبڕن تا دەگەنە مزگەوت و نوێژی بەیانی ئەنجام دەدەن بەکۆمەڵ، لەم بارەوە خۆشەویستﷺ دەفەرموێت: (بَشِّرِ المشائِينَ في الظلمِ إلى المسجدِ بالنور التامِّ يومَ القيامةِ)[15]. واتە: مژدە بدە بەوانەی کە لەتاریکە شەودا زۆر هەنگاو دەنێن لە

---

١٤- أخرجه البيهقي بسند صحيح.

١٥- رواه الترمذي و أبو داود وابن ماجه بسند صحيح.

ڕۆیشتنندا بەرەو مزگەوت، بەڕووناکی تەواو لەڕۆژی دواییدا.

## مژدەی سێیەم:

مژدەی سێیەم بۆ ئەنجامدەرانی نوێژی بەیانی بریتییە لەڕزگاربوونیان لەدۆزەخ و چوونیان بۆ بەهەشت، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (مَن صلَّى البردين دخلَ الجنةَ)[16]. واتە: هەرکەس دوو نوێژی فێنکی (واتە بەیانی و عەسر) بکات دەچێتە بەهەشتەوە. یان دەفەرموێت: (لَن يبلغ النارُ أحداً صلَّى قبلَ طلوعِ الشمسِ وقبلَ غروبِها)[17].واتە: ئاگر بەر ئەو کەسە ناکەوێت کە نوێژی پێش هەڵهاتن و پێش خۆر ئاوابوون بکات، مەبەست لەپێش هەڵهاتنی خۆر نوێژی بەیانییە، پێش ئاوابوونیشی مەبەست پێی نوێژی عەسرە.

---

١٦- رواه البخاري ومسلم.

١٧- رواه مسلم.

## مژدەی چوارەم:

دوو ڕکات لەپێش نوێژی بەیانیەوە خێری بەقەدەر دونیاو ئەوەی تیایدایە.

لەم بارەوە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:(ركعتا الفجرِ خيرٌ من الدنيا وما فيها)[18]. واتە: دوو ڕکات نوێژی سپێدەی بەیان خێرترەو باشترە لەهەموو دونیاو هەرچیش لە دنیادایە!!

سەرنج بدە!! دوو ڕکات نوێژی سوننەت لەپێش نوێژی بەیانیەوە ئەوەندە گەورەبێت و لەدونیاو سەرجەم نیعمەتەکانی گەورەترو باشتربێت، ئاخۆ دەبێت نوێژی بەیانی چەندە گەورەو پیرۆزو خێربێت؟!

ئەوانەی نوێژی بەیانی ناکەن و فەرامۆشیان کردووە بێگومان سەرجەمی ئەو خێرو مژدەو پاداشتانەیان لەدەست دەچێت و لێی بێبەش دەبن.

---

١٨- رواه مسلم.

## مژدەی پێنجەم:

پاداشتی ئەوکەسەی نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ دەکات بریتیە لەپاداشتی ئەوکەسەی کەتا بەیانی شەونوێژی کردبێت، لەم بارەوە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:

(مَن صلّى العشاءَ في جَماعةٍ فَكأنَّما قام نصفَ الليلِ، ومَن صلّى الصبحَ في جماعةٍ فكأنَّما قام الليلَ كلَّه).

واتە: ئەوکەسەی نوێژی عیشا بەکۆمەڵ ئەنجام بدات، وەك ئەوە وەهایە کە تا نیوەی شەوەکە شەونوێژی کردبێت، وە ئەوکەسەی نوێژی بەیانیشی بەکۆمەڵ ئەنجام بدات، وەك ئەوە وەهایە هەموو شەوەکە شەونوێژی کردبێت.

## مژدەی شەشەم:

بەدەستهێنانی شاهیدیدانی فریشتەکان لەلای خوای گەورەو دوعای خێر بۆکردنیان.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (يَتَعاقَبُون فِيكُم ملائكةٌ بالليلِ وملائكةٌ بالنهارِ ويجتمعون في صلاةِ الفجرِ وصلاة

العصرِ ثم يَعرجُ الـذين بـاتوا فِـيكم فيسـألُهم ربُّهـم (وهـو أعلَم بِهم) كيفَ تركتُم عبـادي؟ فيقولـون: تركنـاهم وهُـم يُصلّون وأتَيْناهم وهُم يُصلّون)[١٩].

واته: چەند فریشتەیەك بەشەو و چـەند فریشـتەیەك بـە ڕۆژ بەدیارتانــەوەن و بەســەرە ئێشــكتان لەســەر دەگـرن و، هــەردوولایان لــە نوێـژی بـەیانی و نوێـژی عەسردا یەك دەگرن و یەكتری دەگۆڕن، جـا كاتێك ئـەو تاقمــە فریشــتەیەی كــەوا شــەو لــەدیارتان بــوون ســـەردەكەونەوە بــۆ خزمـــەتی خـــودای گـــەورە و پەروەردگار، لێیـان دەپرسـێت (هەرچـەند كـە خۆیشـی باشتر حاڵیان دەزانێت) دەفەرمووێت: كە ئێوە هاتنەوە ئەو بەندانەی من چیان دەكرد؟ دەڵێن: كە ئێمە چووین بۆ لایان ئـەوان نوێـژیان دەكـرد كـە ئێمـەیش هاتینـەوە لەلایان ئەوان هەر نوێژیان دەكرد).

---

١٩– رواه البخاري.

## مژدەی حەوتەم:

زیکرێکی تایبەتی هەیە لەدوای ئەنجامدانی نوێژی بەیانی کە هەرکەس بیخوێنێت پاداشتێکی ئێجگار گەورەی دەست دەکەوێت، هەروەك خۆشەویستﷺ لەم بارەوە دەفەرموێت:

(مَن قالَ في دُبُرِ صَلاةِ الفجرِ وهو ثاني رجلَيه قبلَ أنْ يتكلَّمَ: لا إله إلا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير، عشرَ مراتٍ كُتِبَ له عشرُ حسناتٍ ومُحِيَ عنه عشرُ سيئاتٍ ورُفِعَ له عشرُ درجاتٍ وكان يومُه ذلكَ في حِرْسٍ مِن كلِّ مَكروهٍ وحرسٍ مِن الشيطانِ ولم ينبغِ لذنبٍ أنْ يُدْرِكَهُ في ذلكَ اليوم إلا الشركُ بالله)[٢٠].

واتە: هەرکەس لەدوای نوێژی بەیانیەوە پێش ئەوەی قسەبکات، ئەم زیکرە بخوێنێت و بڵێت: (لا إله

---

٢٠- أخرجه الترمذي بسند حسن.

إلا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير) و (١٠) جار دووبارەی بكاتەوە، (١٠) خێری بۆ دەنوسرێت و (١٠) گوناهی بۆ دەسڕێتەوە، پاشان (١٠) پلە لەلای خوا بەرز دەكرێتەوە، وە لەو ڕۆژەدا پارێزراو دەبێت لەهەموو خراپەو ناخۆشیەك، پاشان پارێزگاری دەكرێت لەشەیتان.

## مژدەی هەشتەم:

لەدوای تەواوبوونی نوێژەكەی ناوی لەكتێبی پیاوچاكان و وەفدی خوادا تۆمار دەكرێت، لەم بارەوە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (مَن توضـأ في بيتِـه، ثـم أتَـى المسجدَ فَصَلَّى رَكْعَتَين قبلَ الفجرِ ثم جلسَ حتـى يصـلي الفجرَ كُتِبَتْ صلاتُه يَومَئِذٍ في صلاةِ الأبـرارِ وكُتِـبَ في وفـدِ الـرحمَنِ)[٢١]. واتە: هەركەس لەماڵی خۆیدا دەستنوێژ بگرێت، پاشان بچێت بۆ مزگەوت و پێش نوێژی بەیانی

---

٢١- أخرجه الطبراني بسند حسن وحسنه الألباني.

دوو ڕکـات نوێـژ بکـات، دواتـر دابنیشـێت و چـاوەڕوان بکـات تـا نوێـژی بـەیانی بەئـەنجام دەگەیـەنێت، ئـەوە نوێژی ئەوکەسە لەو ڕۆژەدا لە نوێژی پیاوچـاکان تۆمـار دەکرێت، پاشان بەوەفدی ڕەحمان دەنوسرێت.

## مژدەی نۆیەم:

ئەنجامـدەرانی نوێـژی بـەیانی پـارێزراون لەلایـەن پەروەردگارەوە، هەروەك خۆشەویسـتﷺ دەفـەرموێت: (مَـن صَـلَّى الفجـرَ فهـو في ذِمَّـةِ اللهِ عَـزَّ وَجَـل). واتــە: هەرکەس نوێژی بـەیانی ئـەنجام بـدات، ئـەوا لـە پـەنای خوادایەو پارێزراوی ئەوە.یـان دەفـەرموێت: (مَـن صَـلَّى الصبحَ كان في جوارِ اللهِ يومُه)[22].

## مژدەی دەیەم:

ئەنجامدەرانی نوێژی بەیانی ڕێزدار دەکرێن بـەوەی کەبەرەکـەتی خوایـان دەسـت دەکـەوێت، هــەروەك

---

٢٢– أخرجه الطبراني بسند حسن.

خۆشەویست دوعـای بـۆ کـردوون و دەفـەرموێت: (اللـهم بـارك لأمـتي في بكورهـا)[٢٣]. واتـە: ئـەی پـەروەردگارم بەرەکەتی خۆت بدەیتە ئومەتەکەم لەبەرەبەیاندا.

## مـژدەی یازدەیـەم: گـەورەترین مـژدە بـۆ ئەنجامـدەرانی نوێـژی بـەیانی بریتیـە لـە پاداشـت دانەوەیان بەبینینی خوای گەورە لەبەهەشتدا.

(جریـری کـوڕی عبـدالله) دەفـەرموێت: لەخزمـەت پێغەمبەرداﷺ بووین، پێغەمبەرﷺ سەیری مانگی دەکرد لەشـەوی (١٤)دا، پاشـان ڕووی کـردە هـاوەڵان و پێـی فەرموون: (إنَّكم سَتَرَون ربَّكم كما تـرون هـذا القمرَ لا تضـامون في رؤيَتـه فـإنِ إسْـتَطَعْتُم أنْ لا تغلبـوا علـى الصلاةِ قبلَ طلوعِ الشمسِ وقبلَ غروبِها، فافعلوا ثم قـرأ، ﴿ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ﴾[٢٤].

---

٢٣- أخرجه أحمد والترمذي وأبو داود وإبن ماجه.

٢٤- (طه:١٣٠)، أخرجه الشيخان وأحمد وأبو داود.

واته: ئێوه وهك ئهو مانگه پهروهردگارتان دهبینن لهبهههشتدا، هیچ بهربهستێك نیه لهبینینیدا كه هەندێكتان بیبینن و ههندێكی ترتان نهیبینن، بهڵكو ههمووتان بهباشیو بهبێ پهرده خوای خۆتان دهبینن، پاشان بههیچ بیانویهكهوه نوێژی پێش ههڵهاتنی خۆر كه بهیانی دهكات و نوێژی پێش ئاوابوونی خۆر كه نوێژی عهسر دهكات لهدهست مهدهن و فهرامۆشی نهكهن پاشان ئهم ئایهتهی خوێند﴿ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ﴾[25]. ئیمامی موسلیم دهفهرموێت: مهبهست پێی نوێژی بهیانیو عهسره.

## مژدهی دوانزهیهم:

یهكێكی تر لهو مژده گهورهو خۆشانهی كه دراوه به ئهنجامدهرانی نوێژی بهیانی بریتیه له جیاكردنهوهیان له كۆمهڵ و دهستهی دووڕووهكان.

---

٢٥- طه: ١٣٠.

لەم بارەوە پێغەمبەرﷺدەفەرموێت:

(إنَّ أثقلَ صلاةٍ على المنافقين صلاةُ العشاء وصلاةُ الفجر ولو يعلمون مافيهما لأتَوهما حَبْواً)[٢٦].

واتە: قورسترین نوێژ لەسەر دووڕووەکان نوێژی خەوتنان و بەیانییە، خۆ ئەگەر بیانزانیایە چ پاداشتێکیان تێدایە ئەوا گەر بەسنگەخشێ و کاگۆلکێش بوایە دەهاتن (ئەنجامیان دەدا).

## مژدەی سیازدەیەم:

ئەنجامدانی نوێژی بەیانی مایەی سڕینەوەی سەرجەم ئەو گوناهو تاوانانەیە کەبەشەو ئەنجامت داوەو بێگومان نیوەی تەمەنت دەکات، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:

(الصلاةُ الخَمس، والجمعةُ الى الجمعةِ كفارةٌ لما بيْنهنَّ إذا اجتنبت الكبائر)[٢٧]. واتە: (ئەنجامدانی پێنج نوێژە

---

٢٦- رواه البخاري ومسلم.

فەرزەکەو بەجێهێنانی فەرزی جومعە سڕەرەوەی گوناهو تاوانەکانی نێوانیانە بەو مەرجەی گوناهی گەورە نەکرابێت)، بەو مانایەی کە گوناهی نێوان نوێژەکان و تاوانی نێوان هەردوو جومعەکە دەسڕێتەوەو، خاوەنەکەی پاك دەبێتەوە لەسزای ئەو تاوانانەی کە ئەنجامیداوە.

## مژدەی چواردەیەم:

ئەنجامدەرانی نوێژی بەیانی خێرو پاداشتی حەج و عەمرەیەکی تەواویان بۆ دەنوسرێت، هەروەك خۆشەویستﷺ دەفەرموێت: (مَن صلَّى الغداةَ (الصبح) في جماعةٍ ثم قعدَ يذكرُ اللهَ تعالى حتى تطلع الشمس، ثم صلَّى ركعتين كانت له كأجرِ حجةٍ وعمرةٍ تامةٍ تامةٍ تامةٍ)[28]. واتە: هەرکەس نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ بکات،

---

٢٧- رواه مسلم.

٢٨- أخرجه الترمذي، وقال الألباني: حديث حسن.

پاشـــان دابنیشـــێت تـــا كـــاتی خۆرهـــەڵهاتن و یـــادی خوابكات، ئـەو جـا دوو ڕكـات نوێـژ بكـات، ئـەوە خێـرو پاداشتی حـەج و عەمرەیـەكی تـەواو تـەواوی بـۆ دەنوسرێت.

## مژدەی پازدەیەم:

پارێزگـاری كـردن لەنوێـژی بـەیانی بەڵگەیـە لەسـەر ڕاستگۆیی‌و دامـەزراوی ئیمـانی ئەنجامدەرەكـەی، ئـیبن عومـەر دەفـەرمووێت: (كنـا إذا فقـدْنا الرجـلَ في صـلاةِ العشـاءِ والفجـرِ أسـأْنا بـه الظَّـن)[29]. واتـە: ئێمـە گـەر پیاوێكمان نەبینیایە لەنوێژی بەیانیدا گومـانی خراپمـان پێ دەبرد.

## مژدەی شازدەیەم:

فریشتەكانی خوای گـەورە دوعـای خێـر دەكـەن بـۆ ئەوانـــەی كـــە لەجێگـــەی نوێـــژدان و ســـڵاوات دەدەن

---

[29] - قال الألباني وأثر وابن عمر: أخرجه البزار بإسنادين عن نافع عنه.

لەسەریان، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (إنَّ الملائكة تُصَلِّي على أحدِكم مادام في مصلاه الذي صلّى فيه مالم يحدثْ أو يقم: اللهم إغفرْ له، اللهم ارحمْه)[30].

واتە: فریشتەکان صەلەوات لەسەر هەریەکێکتان دەدەن مادەم لەو (جێنوێژ) مەجلیسەیدا ماوەتەوە کە نوێژەکەی تێدا کردووە، بەمەرجێك دەستنوێژەکەی بەتاڵ نەکاتەوە، دەڵێن: خودایە لێی ببورە، خودایە ڕحمی پێبکە.

## مژدەی حەفدەیەم:

یەکێکی تر لەسوودە گرنگ و مژدە خۆشەکان بۆ ئەنجامدەرانی نوێژی بەیانی بریتیە لە هەڵمژینی پاکترین ئۆکسجین لەبەرەبەیاندا، چونکە لەوکاتەدا گازی ئۆکسجین بەڕێژەیەکی زۆر پاکەو تێکەڵی گازە ژەهراویەکانی تر نەبووە، ئەمەش سوودێکی زۆری بۆ

---

٣٠- رواه البخاري.

کۆئەندامی هەناسەو سییەکان هەیەو، مێشك و دڵی مرۆڤ لەوکاتەدا باشترین ئامادەییان تێدایە بۆ وەرگرتنی زانیاریەکان.

## دوا وتە لەم باسەدا

خوێنەری خۆشەویست، دوای خوێندنەوەی ئەم سوودانە چ پاساوێکت هەیە لەنەکردنی نوێژی بەیانیدا؟! چۆن ئامادە دەبیت سەرجەم ئەو مژدەو خێرو بەرەکەتانە لەدەست بدەیت کەبۆ ئەنجامدەرانی ئەو نوێژە فەرزە ئامادەکراوە؟!تۆ بەکاتێکی زۆر کەم خێرێکی زۆرت دەست دەکەوێت گەر مەبەستت بێت!! خۆ گەر بەکاتێکی کەم پارەی زۆرو ماڵی دونیامان دەست بکەوتایە هەمووومان ئامادە دەبووین شەو تابەیانی نەخەوین!! کەواتە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خواو بەهەشت ئامادەبە سادەترین گیانفیدایی ئەنجام بد و بەهەشت بەدەست بهێنە!!

# باسی پێنجەم

## نەکردنی نوێژی بەیانیو زیانەکانی

گومان لەوەدا نیە کە هەر سەرپێچی و لادانێك لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی، مرۆڤ تووشی زیانی زۆر گەورە دەکات، ئەوەی لە ئیسلامدا فەرمان بەکردن و ئەنجامدانی کراوە سوودی گەورەو بەرژەوەندی بالاَی تێدایە بۆ مرۆڤەکان لەدونیاو دوارۆژیاندا، بەپێچەوانەشەوە ئەوەی لەئیسلامدا فەرمان بەئەنجام نەگەیاندنی دراوە، ئەوە بێگومان سوودی تەواوی دونیاو دوارۆژی هەیە بۆ بەندەکان.

یەکێك لەو زیانە ئاشکرایانەی کە دووچاری مرۆڤەکان دەبێت، بریتیە لە نەکردنی نوێژ بەگشتی، وە لەناو نوێژخوێنانیشدا نەکردنی نوێژی بەیانییە بەتایبەتی، کە بەداخەوە زۆرێك لەموسوڵمانان فەرامۆشیان کردووەو بەبەردەوامی لەدوای هەستانیان

لەخەو لەگەڵ نوێژی نیوەڕۆدا ئەنجامی دەدەن. پرسیار کرا لەپێغەمبەرﷺ دەربارەی باشترین کردەوە، ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: (الصلاةُ على وقتِها...)[31]. واتە: نوێژ لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا.

خەڵکی لەئەنجامدانی نوێژی بەیانیدا جیاوازن هەروەك:

- جۆرێکیان بەتەواوی فەرامۆشیان کردووەو ئەنجامی نادەن!!

- هەندێکی تریان ئەنجامی دەدەن بەڵام لەدوای هەڵهاتنی خۆرو هەستانیان لەخەو.

- هەندێکی تریان زۆربەی جار ئەنجامی دەدەن و زۆرجاری تریش فەرامۆشی دەکەن!!

- بەشێکی تریان کەم نوێژی بەیانی لەدەست دەدەن و زۆربەی جار لەکاتی خۆیدا ئەنجامی دەدەن.... .

---

٣١- رواه البخاري و مسلم.

سەرجەم زانایان هاوڕان لەسەر ئەوەی نابێت هیچ نوێـژێك بـەبێ هۆیـەکی دروسـت دوابخرێـت لـەکاتی دیـاریکراوی خۆیـدا، چـونکە یەکـەم کـارو کـردەوە کـە لەڕۆژی دواییدا مرۆڤەکانی لەسـەر موحاسـەبە دەکرێـت بریتیە لەنوێژەکانی. هەروەك خۆشەویست دەفەرموێت: (إنَّ أوَّلَ مايُحاسَبُ به العبد يومَ القيامةِ من عَمَلِه صلاتُه، فإنْ صلحتْ فقدْ أفلحَ، وأنجحَ، وإنْ فسدتْ فقد خـاب و خسـر...). واتـە: یەکـەمین کارێـك کـە بەنـدەی لەسـەر موحاسـەبە بکرێـت لـەڕۆژی دواییـدا دەربـارەی کردەوەکانی، بریتییـە لەنوێـژەکانی؛ ئەگـەر نوێـژەکانی بەباشـی ئەنجامـدابێت ئـەوە سـەرکەوتووەو رزگـاری دەبێت، بـەڵام ئەگـەر بـاش ئـەنجامی نـەدابێت و خـراپ بوبێـت ئـەوە بەهیلاکـدا دەچـێت و ڕەنجـەڕۆ دەبێت.پاشان زیانێکی تـری ئـەنجام نـەدانی نوێـژەکان بەگشتیو نوێژی بەیانی بەتایبەتی ئەوەیە کە مرۆڤەکان لەپاراستن و بەرەکەتی خـوای گـەورە بێبـەش دەکـەن، وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (لاتَتْرُك الصلاةَ مُتَعَمِّداً فإنَّهُ مَن تَرَكَ الصَلاةَ مُتَعَمِّداً فقد برئتْ منه ذمَّةُ الله

ورسوله)[32]. واته: بەبێ هۆ نوێژ تـەرك مەكـەن، چـونكە وازهێنـان لەنوێـژ بـەبێ هـۆ ئەنجامـدەرانی دەردەكـات لەپشتیوانی، ئاگاداری خواو پێغەمبەرەكەی.

سەرنج بدە!! دەبێت چ زیانێـك لـەوە گـەورەتربێت كە مرۆڤەكان بێبەش بن لەسۆزو بەرەكەت و ئاگـاداریو چاودێریو پشتیوانی پەروەردگاریان؟! بـەڵێ زیانـەكان زۆرن و ئەمانە هەندێكیانن:

**زیـانی یەكـەم:** یەكـەمین زیانێـك كـە دووچـاری ئەوانە دەبێت كە نوێژی بەیانی ناكـەن، بریتییـە لـەوەی كە شەیتان لێیان نزیك دەبێتەوە تا (میز) دەكاتە كونـە گوێچكەكانیانەوە!!كەسـێك لـەلای پێغەمبـەرﷺ باسـی پیاوێكی كرد كە نوێژی بەیانی ناكات تـاخۆر هەڵنەیـەت و هـــەر دەخـــەوێت!! پێغەمبـــەریشﷺ لەوەلامـــدا فەرمووی: (ذاك رجـلٌ بـالَ الشـيطانُ في أُذُنَيـه)[33]، واتـە:

---

٣٢- رواه أحمد والبيهقي، و قال الألباني (صحيح لغيره).

٣٣- رواه البخاري ومسلم.

ئــــەوە پیاوێکـــــە کـــــە شـــــەیتان (میـــز)ی کردۆتـــــە گوێچکەکانیەوە.

ئەمـەش بێگومـان بـەمانای ئـەوە دێت کـە شـەیتان هێنـدە مێشـك و گوێچـکەو جەسـتەی ئەوکەسـە قـورس دەکـات کـە نـەتوانێت لـەناو جێگەکەیـدا بەرزبێتـەوەو نوێژەکەی ئەنجام بدات.

**زیانی دووەم:** بێبەشبوون لە بەرەکـەتی خـوایی، هـەروەك پێشـتر باسمـان کـرد کـە پێغەمبـەرﷺ دوعـای خێـری کـردووە بـۆ ئەوانـەی نوێـژی بـەیانی دەکـەن و، داوای لـــەخوای گـــەورە کـــردووە بەرەکـــەتی خـــۆی بەسەریاندا بیارێنێت هـەروەك دەفـەرموێت:(اللـهم بـارك لأُمَّتي في بكورها)..

بێگومان ئەوکەسـەی نوێـژی بـەیانی ئـەنجام نـەدات لەو بەرەکەتە بێبەش دەبێت!!

**زیـانی سـێیەم:** لـەڕۆژی دواییـدا بێبـەش دەبـن لەڕووناکیو ڕزگاربوون و ڕێ ڕۆشنی و لەگەڵ قـاروون و فیرعـەون و هامـان و ئوبـەی کـوڕی خەلەفـدا حەشـر دەکرێن، پێغەمبەرﷺ لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

(ومن لم يحافظْ عليها لم يكن لـه نـورٌ ولا برهـانٌ ولا نجاةٌ وكان يومَ القيامةِ مع قارون و فرعون و هامان وأُبَـي بن خلف)[٣٤].

---

٣٤- رواه أحمد والدارمي والبيهقي في شعب الإيمان، وقال الألباني (صحيح).

# باسی شەشەم

# چارەسەری هەڵنەسان بۆ نوێژی بەیانی

ئەگەر کەسێك ویستی بۆ نوێژی بەیانی بەخەبەر بێت و بەئەنجامی بگەیەنێت ئەوا زۆر بەئاسانی دەتوانێت بەسەر ئەم گرفتەدا زاڵ ببێت و چارەسەری بکات، ئەویش بەم جۆرە:

١- پەناگرتن بەخوای گەورەو پشت پێبەستنی، کە یارمەتیدەرت بێت لەئەنجامدانی ئەم فەرزە گەورەیەدا، بەنیەتێکی پاك و دڵسۆزییەکی زۆرەوە، بێگومان ئەم خاڵە سەرداری چارەسەرەکانەو بەیارمەتی خوای گەورە دەتوانیت زاڵ و سەرکەوتووبیت بەسەر خەوداو تەواوی بەربەستەکان بشکێنیت.

٢- پارێزگاری کردن لەئادابەکانی نوستن هەروەك دەستنوێژو، دوعاکانی نوستن و، خوێندنی قورئان و

ئـەو زیکرانـەی کـە لـە پێغەمبـەری خۆشەویسـتەوە ﷺ وتراون لەپێش نوستنندا.

٣- هەسـتکردن بـەمانا گـەورەو نرخـدارەکانی بەندایەتیو ئەنجامدانی کاری چاکەو خێر، جا چەندە باوەڕی پتـەوی لەدڵـدابێت ئەوەنـدە یارمـەتی دەدات لەزووهەستان بۆ نوێژی بەیانی.

٤- خۆشویستنی خوای گەورە گـەورەترین هۆکارە بۆ چارەسەرکردنی هەڵنەسان بـۆ نوێـژی بـەیانی، مـرۆڤ چەندە خـوای گـەورەی خۆشـبوێت ئەوەنـدەش زووتـرو زیاتر ئیرادەی بەهێزدەبێت لەبەجێهێنانی فەرمانەکانیـدا - گـەر دەیـان بەربەسـتی سـەخت و ناخۆشـیش لەبەدەمیدابێت.

٥- بەسەر نەبردنی کاتـەکان بەشـتانی بێسـوودەوە بەتایبەت لەشەودا، چونکە ئەمە دەبێتە هۆکاری درەنگ خەوتن و بەخەبەر نەهاتن بۆ نوێژی بەیانی.

٦- دوعـاكردن و داواكـردن لـەخواى گـەورە كـە يارمەتيـدەرت بێـت لەبەخەبەرهاتنـەوەدا بـۆ نوێـژى بەيانى.

٧- دوركەوتنەوە لەو هۆكارانەى كە دەبنە مايەى دڵ رەق بوون وەك: (زۆر خواردن و خواردنەوە، قسەى زۆرو، پێكـەنينى بێسـنورو، تـاوان و خراپـەكارىو، حەرامەكان بەگشتى).

٨- بيركردنەوە لەفەزڵ و گەورەيى خێرو پاداشـتى نوێـژى بـەيانى لەگـەورەترين فـەرزى ئيسـلامە لـەدواى شاهيدىدانەوە... .

٩- ترسان لـەوەى كـە ئەگـەر ئـەم نوێـژە گەورەيـە ئەنجام نادات، خواى گـەورە چ سـزاو هەڕەشـەيەكى بـۆ ئامادە كردووە!!

١٠- وەبيرهێنانـەوەى خۆمـان بـەمردن و سـاتە نارەحـەت و دژوارەكـانى سـەرەمەرگ كـە فرسـەت لەدەستماندا نەماوەو بەرەو بارەگـاى خـواى بالادەست

دەڕۆینەوە، ئا لەوکاتەدا کە ناتوانین قەرەبووی نوێژە لەبیرکراوەکانمان بکەینەوەو کارێك ئەنجام بدەین کە پلەو پایەمانی پێ بڵند ببێت لەلای پەروەردگارمان!!

١١- یارمەتیدانی ئەندامانی خێزان لەنێوان یەکتردا بۆ بەخەبەر هێنانەوەی لەکردن و ئەنجامدانی نوێژی بەیانیدا.

یان دراوسێکان لەنێوان یەکتردا، یان هاوڕێیان بەهۆکاری (نامە)یان تەلەفۆن یەکتر بەخەبەر بهێنن، هۆکارێکی زۆرباش و گونجاوە لە هەستاندا بۆ نوێژی بەیانی و بەئەنجام گەیاندنیدا.

١٢- پاککردنەوەی ماڵ لەحەرامەکان وەك هەیکەل و سەگ، هەروەك خۆشەویست دەفەرموێت:

(لاتدخل الملائكة بيتاً فيه كلب ولا صورة)[٣٥].

---

٣٥- أخرجه البخاري ومسلم.

١٣- هەڵبژاردنی هاوڕێی باش و ئیماندار کە هانی یەکتر بدەن لەسەر خواپەرستیو دینداریو دورکەوتنەوەش لەهاوڕێی خراپ و دوور لەخوا... .

## دوا وتەو ئامۆژگاری

خوێنەری خۆشەویست لەدوای گوزەر کردنت بەنێو باس و بابەتەکانی نێو ئەم نوسراوە، دەبێت ئەوە بزانیت کە شەمەندەفەری تەمەن زۆر لەوە خێراتر دەڕوات کە هەستی پێدەکەین و حسابمان بۆ کردووە، هەموو سات و چرکەیەك لەتەمەنی خۆمان دەڕوات و لەزەت و خۆشیو کەیف و رابواردنەکانی ژیانی دونیا زۆر سنوردارو کاتین و پاش ئەنجامدانیان بەچەند چرکەیەك لەبیردەچنەوەو کۆتاییان دێت، گەر هەریەك لەئێمە پرسیارێکی واقعی لەخودی خۆی بکات و بڵێت:

کوا لەزەتی خۆشیەکانی پێشوو؟ کوان سەفاو رابواردن و پێکەنینەکان کە لەخوا بێئاگای دەکردین؟!

خۆشیو لەزەتی ئەو ساتانە کوان کە لەناو پێخەفە گەرمەکانماندا بووین و بانگ بێژ هاواری دەکردو دەیوت: (الصلاة خیر من النوم)؟! نوێژ باشترە لەخەو؟! ئەوانەی باوەڕیان پتەوبوو ڕۆیشتن بەدەم هاواری بانگبێژەکەوەو هەستان نوێژەکانیان ئەنجامداو خێرو پاداشتیان بۆ قیامەتی خۆیان تۆمارکرد، لەبەرامبەریشدا ئەوانەی کە هەڵنەسان بەدەم بانگی خواوەو ناو جێگەی گەرم و نەرمیان پێ باشترو چاکتر بوو لەنوێژی بەیانی، کات بەسەر ئەوانیشدا تێپەڕی، بەڵام ئەوەندەی مابێتەوەو جیاوازی دروست بکات لەنێوان ئەم دوو جۆرە موسڵمانەدا ئەوەیە کە ئەنجامدەرانی نوێژی بەیانی خێرو پاداشتی خۆیان دەست کەوت و ئەوانەشی لەکاتی بانگی بەیانیدا جێگەکانیان دەدایەوە بەسەر خۆیاندا تا خەویان

نەزرێ، لەغەیری پەشیمانیو پەنجەگەزین و تۆمارکردنی گوناهو تاوان هیچ دەستکەوتێکی تریان نەبوو!!

بەتەنها ئەوەی کە دەمێنێتەوەو دەکرێتە جێی شانازی بۆ بەندەکان کار و کردەوەی چاکەو ئەو ساتانەیە کە لەخزمەت خواو دینەکەیدا بەسەربراون و سەرجەمی شتەکانی تر دەڕۆن و کۆتاییان پێدێت.کەواتە پێش ئەوەی بچینەوە خزمەت خواو بڵێین:

﴿ يَٰحَسۡرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴾[36].

واتە: ئاخ و پەشیمانی بۆ هەموو ئەو لادان و نادروستیانەی کە کردم و فەرمانی خوام شکاند و لەو کەسانە بووم کە گاڵتەیان بەدینی خوا دەکرد.کەواتە سەرجەمی نوێژەکانت لەکات و ساتی دیاریکراوی خۆیاندا ئەنجام بدە بەتایبەت نوێژی بەیانی، زانایان و سەلەف وەك پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و زۆرێك

---

٣٦- الزمر:٥٦.

لەزانایانی سەردەم باوەڕیان وەهایە کە نەکردنی نوێژ جا بەهەر هۆیەکەوە بێت، خاوەنەکەی لەئومەتی ئیسلام دەردەکات!! کە بێگومان ئەوە زەنگێکی ترسناکەو ئەوانە ئاگاداردەکاتەوە کە نوێژناکەن یان بەبێ هۆیەکی شەرعی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا ئەنجامی نادەن. پاشان ئەوە بزانە و دڵنیابە لەوەی کە هەرکەس لەئێمە کە دەخەوێت، شەیتان (سێ) گرێ لە پشتی سەری دەدات تا بەتەواوی بێئاگاو مەستی بکات لەیادی خواو ئەنجامدانی نوێژی بەیانی، هەرکات بەندەکان بەخەبەرهاتن و یادی خوایان کرد یەکێك لەگرێکان دەکرێتەوە، پاشان کە دەستنوێژی گرت دووەم گرێیش دەکرێتەوەو گرێی سێیەمیش بەئەنجامدانی نوێژەکە دەکرێتەوەو گرێکانی شەیتان کۆتاییان پێدێت!! بەمەیش تۆی ئەنجامدەری نوێژی بەیانی ناوت تۆمار دەکرێت لەنێو نەفسە باشەکان و جیادەکرێیتەوە لەنەفسە پیس و خراپەکان،

خۆشەویست لەم بارەیەوە دەفەرموێت:(یَعْقِدُ الشیطانُ على قافيةِ رأسِ أحدِكم ثلاثَ عُقَدٍ إذا نام، بكلٍّ عقدةٍ يضربُ عليك ليلاً طويلاً، فإذا استيقظ فذكر الله انحلتْ عقدة، وإذا توضأ انحلتْ عنه عقدتان، فإذا صلّى انحلتْ العقد، فأصبح نشيطاً طيبَ النفسِ، وإلا أصبح خبيثَ النفسِ كسلان)[٣٧].

بێگومان کردنەوەی ئەو گرێ شەیتانیانەش تەنها بەهەڵسان و ئەنجامدانی نوێژەکەت دەبێت...

٣٧- رواه مسلم.